زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان (٤)

# ئیبن سینا

## مالکۆڵم یاپ

## و: ئاگری نەفشین

٢٠١٧

## ناوەڕۆك:




نەخشەی وڵاتانی موسڵمان لە سەردەمی ئیبن سینا

## پێشەکی:

ئیبن سینا کێ بوو؟ بۆچی کتێبێك بە تەنیا لەم زنجیرەیەدا تایبەت کراوە بەم کەسایەتیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە ئاشنامان دەکات بە خودی ئیبن سینا و بەشێکیش لە مێژووی جیهان. ئیبن سینا لە ساڵی ٩٨٠م لە ئەفشەنە یان خەرمیسن لە شاری بوخارا لە دایك بووە، کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئاسیا و سەر زەوی وڵاتانی موسڵمان. لەو کاتەدا ناوەندی ئاسیا شوێنی پەیوەندی کەلتورە جیاوازەکانی جیهان بوو. ئاسیای ناوەڕاست لە لای ڕۆژهەڵاتەوە و بە درێژبوونەوەی چیاکانی پامیر لە گەڵ چین یەکگدەگرێتەوە و لە لای باشورەوە ڕێگەی هیندوکش لە گەڵ وڵاتی هیند یەکدەگرێتەوە؛ ئەو کاروانانەی کە بۆ کڕین و فرۆشتنی کاڵاکانیان دەهاتنە ئاسیایی ناوەڕاست، ئەندێشەو بیرۆکەکانی ڕۆژهەڵاتیان بەرامبەر ئەندێشەکانی ئیسلام بەرابەرکێ پێ دەکردن. لەم پێوەندی وبەرخوردەی بیرۆکەکان فەرهەنگێکی نوێ سەریهەڵدەدا. باوکی ئیبن سینا لە شاری بەڵخ ژیاوە، کە دەکەوێتە چەند کیلۆمەتری باشووری بوخارا، ئەم شارە ڕۆژگارێك پایتەختی یەکێك لە حکومەتەکانی ئەسکەندری مەقدونی بوو لە ئاسیای ناوەڕاست. بەم پێیە ناوەندی ئاسیا شوێنی بەیەکگەیشتنی فەرهەنگە جیاوازەکان بووە، وەکوو بودیسم لە هیند، مسیحیەت و ئیسلام لە سنورەکانی ڕۆژئاوا، ئاینی کۆنی زەردەشت لە ئێران و ئەندێشەی چینی.

ئاسیایی ناوەڕاست دەشتێکی تەختی هەیە کە چواردەورەی بە چیای بەرز دەورەدراوە. لەوەرگەی

چاك و لەباری دامێن چیایەکان ببووە شوێنگەی شوان و ئاژڵداران کە ڕواڵەتی ژیانی ئەوان لە گەڵ شارنشین و لادێ نشینەکان جیاوازی زۆری هەبوو. بۆیە لە ئاسیایی ناوەڕاست تورکەکان و فارسەکان دوو شێوازی ژیانی لێك جیاوازیان هەبوو یەکەم شوانی یان کۆچ و دووەم شارنشینی.

ئیبن سینا لاویەتی خۆی لە بارودۆخێکی ئاوادا بەسەربردووە، و ئەم بارودۆخە جیاوازەش بووە هۆی ئەوەی بابەتەکان لە دیدگایەکی نوێوە بەرڕسی بکات.

## جیهانی ئیسلام و گوڕانکاری

لەشکری ئیسلام پانتایەکی زۆری لە ژێر دەستدا بوو، توانیان پانتایەکی زۆر لە سنورەکانی فەڕانسەوە بگرە تا دوورترین وڵاتانی عەربنشینەکان بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و ئیمپراتۆریەتێکی نوێ بونیاد بنێن. خەلافەتی ئیسلامی سێسەد ساڵ بەر لە دایك بوونی ئیبن سینا بونیادنرابوو و لە سەردەمی ئەودا ئەم خەلافەتە بەتەواوی ئاڵوگۆڕی بەخۆوە بینیبوو.



سیمای ئیبن سینا لە ڕووی پێکهاتەی کەللەسەری.



بوخارا، نموونەیەك لە شاری موسڵمانان كە خانوەكانیان چوار گۆشە دروست كردووە.



قوتابخانەیەك لە بوخارا، كە قوتابییەكان لە حوجرەكان دەمانەوە.

زۆری پێ نەچوو خەلافەتی ئیسلامی لە ساڵی ٧٥٠م کە بەنی ئومەمیە دەسەڵاتداربوون کۆتاییان پێ هاتوو و خەلافەتی عەباسی جێیگرتەوە. لەم نێوانەدا کەسێك لە ئەهلی بەنی ئومەمیە کە بانگەشی خەلافەتی دەکرد هەڵات بەرەو ئیسپانیا و لەوێ بە ڕاگەیاندنی سەربەخۆی ئیسپانیا دەستگایەکی خەلافەتی نوێی دروستکرد. دوابەدوای ئەم باسە لە باکوری ئەفریقاش شۆڕشێکی دیکەش سەریهەڵدا و لە ساڵی ٩٦٩م گروپێکی دیکە لە موسڵمانەکان خەلافەتێکی دیکەیان بە ناوی فاتمیەکان لە میسر بونیادنا. هاوکاتی خەلافەتی فاتمیەکان لە میسر کاربەدەستانی ناوچەیەکانی ئێران و ئاسیایی ناوەڕاست ئیعلانی حکومەتی سەربەخۆیان لە خەلافەت کرد. لەو کاتەدا لە بوخارا سامانییەکان حکومڕانیان دەکرد و ئیبن سیناش تەمەنێکی زۆر خزمەتی بە سامانیەکان کرد.

لە سەر زەوی عەرەبستانیش ئیمپراتۆریەتی عەرەب دەوامی نەهێنا. قەبیلە عەرەبەکان جەنگاوەری بەتوانا بوون بەڵام لە بەڕێوەبردنی وڵات بێ توانا بوون. عەرەبەکان بێ توانا بوون لە چلۆنیەتی بەڕێوەبردنی ناوچە فەتحکراوەکان، هەربۆیە ناچار بوون بۆ ئیدارەکردنی ئەم ناوچانە پشتیان بە خەڵکانی وڵاتانی شکستخواردوو دەبەست. ئەو کەسانەی لە دەوڵەتدا پشتیان پی٘دەبسترا زۆرجار خەڵکی دوو ئیمراتۆریەتی پێشووتر ئێران و ڕۆم بوون.

ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی شکستخواردووی ڕۆمی بێزەنتی دەکەوتە ڕۆژئاوای خەلافەتی ئیسلامی و خەڵکەکانیشی کە ئێمە ئێستا پێیان دەڵێن یۆنانیەکان زیاتر شوێنکەوتەی ئایینی مەسیحیەت و لە مەزهەبی ئۆرتۆدۆکس بوون. ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی شکستخواردووی ئێرانیش کەوتبووە ڕۆژهەڵاتی خەلافەتی ئیسلامی، کە دانیشتوانەکەی شوێنکەوتەی ئایینی زەدەشتی بوون.



مزگەوتێکی شین لە بوخارا.



قەبری یەکێك لە پادشاکانی سامانی لە بوخارا.

گەرچی زۆربەی ئێرانیەکان و ڕۆمیەکان ئاییینی ئیسلام و زمانی عەرەبیان وەکو دین و زمانی ڕەسمی وڵاتەکانی خۆیان پەسەند کردبوو، بەڵام هەندێ جار لە ڕووی ناچاری گوێڕایەڵی قەبیلە عەرەبەکانیان دەکرد، بەڵام وا دیار زۆریش خۆشحاڵ نەبوونە لە سەرکردایەتی عەرەبەکان بەسەریانەوە.(لێرەدا ئەوەش بڵێین کە دڵسۆزانی ئەم سەرزەمینانە ساڵانێکی زۆر لە خەبات دابوون بۆ بە دەستهێنانی ئازادی و یەکسانی، کە ئیسلام بانگەشەی ئەوەی دەکرد. بە هاتنی لەشکری ئیسلام ئەو کسانە لەبەرامبەر لەشکری ئیسلام بەرەنگاریان نەکرد.)

بە تێپەربوونی کات ئێرانیەکان و ڕۆمیەکان پێگە گرنگەکانی خەلافەتیان گرتە دەست، ئێستا عەرەبەکان تەنها جەنگاوەرانێکی ئازا بوون کە بە تێپەربوونی کات ئەوەشیان لە دەستدەدا. عەشیرەتە عەرەبەکان دەستیان کرد بە جەنگ و ئاژاوە بەرامبەر یەکتر و ئاشوبیان دژی دەسەڵاتی خەلافەتیش دەگێڕا. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە عەباسییەکان وردە وردە فەرماندەیی سوپایان دەدایە دەست بەردەکان، کە زۆر جار ئەو بەردانە شوانە جەنگاوەرە تورکەکان بوون، ئەوانیش بەرە بەرە دەسەڵاتیان وەدەستهێنا و لە کۆتادا دەسەڵاتی بەڕێوەبەری خەلافەت کەوتە ئەستۆی تورکەکان، و خەلیفەکانی عەبباسی تەنها بە ناو فەرمانڕەوا بوون.

له زەمانی ئیبن سینا بەڕێوەبەری خەلافەتی ئیسلامی له ئەستۆی ئێرانیەکان، یۆنانیەکان و تورکەکاندا بوو. ئەوەی بۆ عەرەبەکان مابویەوە تەنها زمانی عەرەبی بوو وەکوو زمانی ڕەسمی خەلافەت و زمانی یاسا و پەرەوەردو فێربوونی زانستی ئایینی. ئیبن سینا ئێرانی بوو بەڵام تەقریبەن هەموو کتێبەکانی بە زمانی عەرەبی نوسیبوو.

وتمان کە ئیبن سینا ئێرانی بوو بەڵام لەو کاتەدا کەس گرنگی بەم خاڵە نەدەدا. هۆکارێکی دیکەی نەمانی خەلافەت لە دەست عەرەبەکان گرنگی نەدان بوو بە ملیەتی پیاوانی حکومەت، بۆیە ئیتر ئیمپراتۆریەتی عەرەب ببوو بە خەلافەتی ئیسلامی یاخود ئیمپراتۆریەتی موسڵمانان.

سیستەمی حکومەتی ئیسلامی لە پاش وەفاتی پێغەمبەر درودی خودای لەسەربێت بە هاوکاری خولەفای ڕاشدین بونیادنرا. پێغەمبەر موحەممەد (درودی خودای لێبێت) پەیام هێنەری ئایینی ئیسلام بوو و بونیادنەری ئەم ئاینەش بوو، ئەوانەشی کە پاش ئەو بوون بە جێنشین، نیزامی ئیسلامیان وەکوو بەرنامەی ژیان بەرفراوانتر کرد و هەر لە زەمانی ئیبن سیناش بوو کە ئەم سیستەمە بەرەو کامل بوون دەچوو.

## پێکهاتەی ئیسلام

ژیانێکی کۆمەڵایەتی ئاشتەوایی بە لانی کەم پێویستی بە نیزامێکی حوکمڕانییە کە لە لایان خەڵکەوە پەسەند بکرێت. هەرنەبێ بیروباوەڕی هاوبەشیان هەبێت. ئەگەر خەڵك لە مەڕ یاسا بنەڕەتیەکاندا هاوڕانەبن ئەوا یاسا بە ئاسانی پێشێل دەکرێت و دژایەتیشی دەکەن. بونیادی حکومەت لە سەر یاسا بەناکراوە و بیروباوەڕی هاوبەشیش لە ڕێگەی پەروەردە و فێربوونەوە بەرهەم دێت. هەرلەبەرئەمەش بوو کە ئەوانەی لە دوای پێغەمبەرەوە بوون بە جێنشین زۆر گرنگیان بەم لایەنە دەدا.

خەلافەتی ئیسلامی خەڵکانێکی لە کەلتور و فەرهەنگی جیاواز لە خۆ گرتبوو، بۆیە ئەرکی خەلیفەکان بۆ دروستکردنی ژیانێکی ئاشتیانە زۆر ئاسان نەبوو.

عەرەبەکانی سەرەتای خەلافەت بۆ ئیدارە کردنی حکومەت پەیڕەویان لە نیزامی جۆراوجۆری حوکمڕانی دەکرد.



مزگەوتی ئیبن تولون لە میسر، کۆنترین پەرستگا لە میسر.




لاپەڕەیەك لە قورئانی پیرۆز

لەم سیستەمەدا خەڵکانی غەیرە موسڵمانی سەرزەمینە جیاوازەکان ئازاد بوون لە پاراستنی ئاینەکانی خۆیان بە مەرجی قەبوڵ کردنی فرامانڕەوایی ئیسلام بەسەریانەوە. بۆیە موسڵمانەکان ناچار بوون بۆ ئیدارە کردنی ناوچە فەتحکراوەکان گۆڕانکاری لە سیستەمی فرمانڕەوایدا بکەن. قەبولکردنی ئەم ڕەوشە بۆ موسڵمانەکان کە خەلافەتیان وەکو کەرەمی خودا دەزانی، ئەم گۆڕانکاریانەیان بە بیدعە و سەرپێچی لە فەرمانی خودا دەزانی.

بۆ بەدیهێنانی نیزامێکی نوێ لە حکومڕانیدا و لە چوارچێوەی ئیسلامدا موسڵمانەکان هەڵبژاردەی دیکەیان هەبوو کە گرنگترینیان بریتی بوون لە: پەیامی خودا بۆ پەیامبەر و موسڵمانان واتە قورئانی پیرۆز؛ بەڵام موسڵمانەکان هەر زوو ڕوبەڕووی هەندێ ڕووداو بوونەوە کە بە ئاسانی وڵامەکەی لە قورئاندا نەدەدۆزرایەوە بۆیان. لۆیە موسڵمانەکان بۆ چارەسەرکردنی هەندێك لە موشکیلەکان پەنایان برد بۆ وتەکانی پەیامبەر کە نەنوسرابونەوە. بۆ نموونە (ئەلیف دەیگوت من لە بائم بیستووە کە لە پائەوە دەیگێڕایەوە) بێگومان ڕەوشێکی لەم جۆرە بێ هەڵەش نابێت، بەڵام قازانجێکیشی هەبوو کە ئەویش لە خراپی دەرئەنجامەکەی دەکرا ڕیوایەتەکە بە زەعیف یان نادروست لە قەڵەم بدرێت!

بە پێی تێپەڕبوونی کات زۆرێك لەم ڕیوایەتانە لە لایان زۆرینەوە پەسەند کران و لە کتێبان بە ناوی فەرموودە کۆکرانەوە. یەکێك لە گرنگترین کتێبەکانی حەدیث یاخود فەرموودە کتێبی کەسێك بوو لە ئەهلی بوخارا بە ناوی سەحیحی بوخاری کە چەند ساڵ بەرلەدایك بوونی ئیبن سینا نوسرابۆوە. ئەم فەرموودانە چەندین سونەتیان هێنایە بوون کە شوێنکەوتوانی ئەم سونەتانە ناویان لێنرا سونی. لە گەڵ ئەمەشدا هێشتا موسڵمانەکان دوچاری هەندێ بارودۆخ یاخود مەسائیل دەبوونەوە کە قورئان و فەرموده بە تەنهایی وەڵامگۆی ئەو بابەتانە نەبوون. ڕەوشێکی دیکە لەم بوارەدا پرسیارکردن بوو لە دادوەرێك(قازی)، بەڵام ئەوەش ئاسان نەبوو چونکە

بابەتێك لەوانەیە دادوەرێك هاوڕا بوایە لەسەری بەڵام لە ڕوانگەی چەندین دادوەری دیکەوە نادروست بوو. بۆ لە نێوبردنی ئەم کێشەیەش ڕەوشێکی دیکەیان داهێنا ئەویش (ئیجماع) بوو کە دەبوو یاسایەکی نوێ یاخود وەڵامێك بۆ موشکیلەیەك بە پێی ڕەزامەندی چەند زانایەك بوایە. بۆ ئەوەی لە دوای دەرچونی یاساکە لای هەموان پەسەند بێت. ڕەوشێکی دیکە لەم بوارەدا لە کاتی ڕوبەڕوبونەوەی کێشەکان سوودی لێوەردەگیرا، کارکردن بوو بە (قیاس)؛ بۆنموونە مانای قیاس ئەوە بوو کە ئەگەر بابەتێك لە بارەی زەڕافەوە هاتبایە پێش کە لە هیچ یەك لە کتێبەکانی فەرمووده و لە قورئانیشدا شتێکی وای لەمەڕ ئەم بابەتەوە باس نەکردبێت، دەتوانرێت کار بکرێت بەو دەستورو یاسایانەی کە لەبارەی وشترەوە باس کراوە، چونکە تاڕادەیەك هاوشێوەی یەکترن.

گرنگترین و پڕئاستەنگترین بابەت، بابەتی خەلافەت و دیاریکردنی جێنشین بوو. دەستەیەکی دیکە لە موسڵمانەکان لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە بۆ دیاریکردنی پێشەوای موسڵمانان دەبێ پشت بە ئیرادەی پەروەردگار ببەسترێت. ئەم گروپە لە موسڵمانەکان بە شیعە ناویان دەرکرد. ئەوان ویستی خودایان پێ ئیمامەت بوو واتە ئیمامی عەلی ڕەزای خودای لێبێت و کوڕەکانی. ئێستا خەلیفەکانی فاتمیە یان فاتمیەکانی میسر یەکێك بوون لە گروپە دەسەڵاتدارەکانی میسر، کە بەئیسماعیلیەکان ناودێربوون. ئیسماعیلیەکان ئەوەندە دەسەڵاتدار بوون کە سونیەکان ترسیان لێ نیشت. بانگخوازەکانی ئیسماعلیە لە هەموو شوێنێك بانگەشەیان دەکرد: باوك و برای ئیبن سیناش لایەنگری ئەم گروپە بوون. هەندێك لەوانەی شوێنیان ئارخەیان نەبوو لای ئەهلی سونەت ڕویان دەکردە لای ئیسماعلیەکان و لەوێشدا بە شان و باڵی ئەوانیاندا هەڵدەکوت.

## پەروەردەو فێربوون

سیستەمی حوکمڕانی ئیسلام پێویستی بە کەسانی لێهاتوو و زانا هەبوو، و فێرکاریش لەسەر بنەمای دروست بیرکردنەوە و تێفکران بوو لە بابەتە زۆر هەستیارەکان. لە خەلافەتی ئیسلامی دوو جۆرە قوتابخانە هەبوو: هەوەڵ (قوتابخانە) کە زۆرجار لە نزیك مزگەوتێکەوە بوو؛ کە تایبەت بوو بە کوڕان و بابەتەکانی خوێندنیش خوێنندنەوە و نوسین و قەرائەتی قورئان بوو. دووهەم (قوتابخانەی زانستی) بوو کە تایبەت بوو بە پیاوان وگەنجان و تازەپێگەیشتوان. بابەتەکانی فێربوونیش بریتی بوون لە یاسای شەرعی، زانست و خوداناسی و بابەتی دیکە. قوتابخانە علمیەکان لەسەردەمی ئیبن سینا دروستکران و شاری بوخاراش یەکێك بوو لە شارە بە ناوبانگەکان لە ڕووی هەبوونی قوتابخانەی زانستی پێشکەوتوو. ئەو کاتەی ئیبن سینا سەرقاڵی فێربوونی زانستە جیاوازەکان بوو، ئەم قوتابخانانە زیاتر تایبەت بوون بە پەروەردە کردنی قوتابی لەسەر بابەتێکی دیاریکراو.



زانکۆی ئەزهەر، کۆنترین زانکۆی موسڵمانان لە ساڵی ٩٧٠ کۆچی بونیاد نراوە.

گەورەترین کێشەی قوتابی یاخود فێرخوازی ئەم قوتابخانانە نەبوونی کتێبی پێویست بوو، لەبەرئەوەی کتێبەکان بە دەست دەنووسرانەوە و ئامێری چاپیش نەبوو، ژمارەی کتێبەکان ئەوەندە زۆر نەبوون. هەتا کتێبخانەکانیش زۆر نەبوون. ئیبن سینا بە هۆی خزمەت کردنی لای ساسانیەکان توانی سوود لە کتێبخانەکانی ئەوان وەربگرێت.

لەو دەورەیەدا پەرەوەردوخوێندن زیاتر تایبەت بوو بە کوڕان، کچان تەنها لە ماڵەوە دەبوون و سەرقاڵی کاری ماڵەوە بوون.

فێرکردنی خەڵکی بە جۆرێك کە هەموو وەکوو یەکتر بیربکەنەوە کارێکی ئاسان نییە. لەوانەیە ئەگەر بارودۆخ و پێداویستی بۆ هەمووان وەکوو یەکبێت ئەو کارە گونجاو بێت. بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە هەندێك ئەو بابەتانە موتاڵا دەکەن کە لە گەڵ بیرۆکە و بیرکردنەوە کۆنەکان یەکناگرێتەوە. لە هەر نیزامێکدا و بە تایبەت ئیسلام کە هەموو مەسائیلەکان بەیەکەوە پەیوەستن، ئەگەر بەشێك گومانی لەسەر دروست ببێت زۆر بە خێرایی هەموو سیستەمەکە دەکەوێتە ژێر گومانەوە؛ ئەوەش ئەو خاڵە بوو کە ئیبن سینا و زانایانی دیکەی ئەو کاتە سرنجیان دابوو.

کاربەدەستانی حکومەت ترسیان لەم زانستە نوێیانە هەبوو بە هۆی ناهەماهەنگی ئەم زانستانە لە گەڵ سیستەمێك کە چەرمەسەری زۆریان بۆ کێشا بوو. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم زانستانە نوێ نەبوون، بەڵکو زانستی کۆنی یۆنان، کە وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی عەرەبی لە لایان یهودی و مەسیحییەکانی دانیشتوانی خاکی ئیسلام. ئامانجی ئیبن سینا و فیلسوفەکانی دیکەی ئیسلام هەماهەنگ کردنی ئەندێشەی فەلسەفەی یۆنانی بوو لەگەڵ ئیسلام.




ئاراستەی سەفەرەکانی ئیبن سینا

جیهانی ئیسلام لە سەردەمی ئیبن سینا لە قەیراندا بوو. موسڵمانەکان ڕووبەڕووی ئاڵوگۆڕی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ڕوناکبیری ببونەوە کە جیاوازی هەبوو لە گەڵ سەردەمی فەتح کردنی دەسەڵاتی ڕۆمی و ئێرانیەکان. هەنوکە فیلسوفە موسڵمانەکان ئامانجیان دۆزینەوەی ڕێگەیەك بوو بۆ پێشکەوتن

## ژیانی ئیبن سینا

ئیبن سینا قوناغی ئاسایی قوتابخانەی تەواو نەکرد. زۆرێك لە مامۆستاکانی ئیبن سینا لە دۆستانی باوکی بوون. هەر لەم ڕێگەیەوە بوو کە لە گەڵ ئەندێشە نوێیەکان ئاشنایەتی پەیدا کرد. بە گوێرەی وتە موبالغەکارانەکەی دەیووت هەموو شتێکی زۆر بە خێرایی وەردەگرت و قوتابیەکی کۆششکار بوو کە لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا شارەزایی لە زانستەکانی مەنتیق(لۆجیك)، بیرکاری، زانست، پزیشکی و شەریعەتی ئیسلامی بە تەواوی بەدەستهێنا و هەر لەو تەمەنەشدا بوو کە دەستی کرد بە موتاڵاکردنی فەلسەفە.

ئیبن سینا ٢١ ساڵ بوو کە باوکی وەفاتی کرد بۆیە ناچار بوو کە بە دوای کاردا بگەڕێ بۆ بژێوی ژیانی خۆی. ئیبن سینا ساڵانێکی زۆر لە ئاسیای ناوەڕاست و ئێران لە سەفەرکردندا بوو لەم شار بۆ ئەو شار، خزمەتی بە زۆرێك لە فرمانڕەواکانی ئەو سەردەمە کردووە. لە هەمەدان بە هۆی چارەسەرکردنی نەخۆشی گەدەی حاکمی شاری هەمەدان توانی بچێتە وەزارەتەوە. دواتر ئیبن سینا ڕووی کردە ئیسفەهان و چواردەساڵی کۆتایی تەمەنی لەوێدا بەسەربرد.


مزگەوتی شا لە ئیسفەهان

لە ئیسفەهان هەموو بەیانیێك لە خەو هەڵدەستا و سەرقاڵی موتاڵاکردن و نوسین دەبوو، دوای ئەوەی دەرسی بە قوتابیەکانی دەوت دەچوو یارمەتی فەرمانڕەواشی دەدا لەبڕیوەبردنی کارەکانی. ئێوارانیش دوای نانخواردن سەرقاڵی گفتگۆ و خواردنەوە بوو لە گەڵ دۆستەکانی، دوای ئەوەش تا درەنگانی شەو خەریکی خوێندنەوە دەبوو. کاتێك هۆکاری ئەم سەخت تەلاشکردنەیان لێ پرسی لەوەڵامدا ووتی: زۆربەی تەمەنی خۆی لە سەرنجدان لە بەرفراوانی ژیان بەکاردەهێنێت و کەمێکی تەمەنیشی بۆ کەیف و خۆشی بەکاردێنێت. ئیبن سینا لە ئەنجامدا بە هۆی زۆر خۆماندووکردن و کۆششی زۆر لە تەمەنی ٥٨ ساڵی لە ٤٢٨ کۆچی وەفاتی کرد.

ناوبانگی ئیبن سینا نە بە هۆی پلەوپایەکەی لە دەوڵەتدابووە و نە بەهۆی چاکی خۆیەوە بووە. وەك دەلێن ئیبن سینا کەسێکی لە خۆبایی بووە کە زۆر جار خەڵکی لە خۆی دەڕەنجاند هەر لەبەر ئەوەش بوو هەندێك جار دەیانووت ڕیاکاری دەکات. ئەو زۆر لە پێش سەردەمی خۆیەوە دەژیا و شێوازی ژیانی ئەو لە گەڵ خەڵکانی دیکەی ئەو زەمانە جیاوازی هەبوو بۆیە کە نیگەران دەبوو دەیگوت: خۆزگە دەمزانی من کێم؟ لەم جیهانەدا بە دوای چیدا دەگەڕێم؟

نێوبانگی ئیبن سینا زیاتر بە هۆی نوسینەکانیەتی. لەم چەند لاپەڕەیدا ناپەرژێینە سەر هەموو بەرهەمەکانی ئیبن سینا بۆیە زۆر بە کورتی تەنها لە سەر دوو بابەت دەوەستین کە زیاتر لەودا ڕەنگی داوەتەوە، پزیشکی و فەلسەفە.

## پزیشکی

سەد ساڵ پاش وەفاتی ئیبن سینا دوو لە نەخۆشەکانی پزیشکی عەرەب (سابت) بانگهێشت کرابوون بۆ سەرزەمینی مەسیحیەکان بۆ چارەسەرکردن. بەڵام بە هۆی خۆتێهەڵقورتانی نەزانانەی پزیشکێکی ئەوروپی هەردوکیان مردن.

یەکێك لە نەخۆشەکان پیاوێك بوو کە قاچێکی زیانی بەرکەوتبوو و پزیشکە ئەورپیەکە خێرا لاقی نەخۆشەکەی بە تەورێك بڕیەوە. نەخۆشی دووهەم ئافرەتێك بوو کە نەخۆشی سیلی هەبوو پزیشکە ئەورووپیەکە بە گومانی ئەوەی شەیتان لە کەلەیدا لانەی دروستکردووە، سەری نەخۆشەکەی کون کردو کەمێك خوێی تێکرد. سابت کە تەواو لەم دیمەنانە حەپەسا بوو نەیتوانی هیچ بکات و نەخۆشەکان یەکسەر گیانیان لە دەستدا. هەستی سابت لەو سەردەمەدا بەرامبەر ئەو پزیشکە ئەورپیانە هەروەك هەستی پزیشکێکی ئەورووپی ئەم سەردەمەیە بەرامبەر یەك پزیشکی جادووگەر.

دەبینی کە پزیشکە موسڵمانەکان لەوسەردەمەدا چەندە لە پزیشکە ئەورووپیەکان پێشکەوتوتر بوونە. ئەم پێشکەوتنەش بە هۆی پیاوانێکی وەکو ئیبن سیناوە بووە. پزیشکە موسڵمانەکان لەچاو پزیشکە ئەورپیەکان خاوەن کەرەستەو ئامرازی پێشکەوتوتر بوون. گرنگترین سەرچاوە پزیشکیەکانی موسڵمانان تەرجەمە عەربیەکانی بەرهەمە پزیشکیەکانی یۆنان وەکو بوقرات(٤٦٠ پێش میلاد) و جالینوس (٢٠٠ تا ١٣٠م)بوو.

جگە لە سەرچاوە یۆنانیەکان، موسڵمانەکان سوودیان لەسەرچاوەی چینی و هیندیەکانیش وەردەگرت و هەروەها بە هۆی بازرگانیش لەگەڵ میلەتانی دراوسێ زۆر شتی نوییان بەدەست دێنا. یەکێکی دیکە لە پزیشکە بەناوبانگەکانی موسڵمانان زەکەریای ڕازی بوو(٢٤٤ تا ٣١٤ك) کە بەر لە ئیبن سینا ژیاوە و دواتر لە سەردەمی ڕێنسانس لە ئەوروپا زۆر بەناوبانگ بوو. زەکەریای ڕازی کتێبی زۆری لە بارەی پزیشکیەوە نووسیەوتەوە کە بەناوبانگترین کتێبەکانی بریتی بوون لە: مەوسوعەی پزیشکی (الحاوی)، کتێبێك لە بارەی نەخۆشی ئاوڵە(الجدری) و چەندین کتێبی دیکەی بەنرخ.



ئیبن سینا لە کاتی وانە وتنەوە.( ئەم نەقاشیە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەی زایینی لە ئێران)



پزیشکێکی عەرەب لە کاتی چارەسەرکردنی نەخۆش.



دەرمانخانەی یەکێك لە پزیشکە عەرەبەکان.

ئیبن سینا لە نوسینەوەی کتێبە پزیشکیە بەناوبانگەکەی بە ناوی قانون بەرهەمەکانی ڕازی و زانایانی دیکەی موتالا کردوون. کتێبی قانون یەکێك بوو لەو سەرچاوانەی کە پزیشکەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەو کاتەدا و پزیشکانی ئەوروپیش بۆ ماوەی ٦٠٠ ساڵ پشتیان پێ بەستووە. هەوەڵین جار کتێبی قانون لە سەدەی دوانزەهەم بۆ زمانی لاتینی تەرجەمە کرا و دوای پەیدا بوونی سنعەتی چاپ ئەم کتێبە تا کۆتایی سەدەی شانزدەهەمی زایینی واتە سەرەتای شۆڕشی زانستی و داهێنانە نوێیەکان، ٣٦ جار لە چاپ درایەوە.



کتێبی (القانون في الطب)

بێگومان بیروباوەڕی ئیبن سینا لەبارەی هەندێك لە نەخۆشیەکانی ئەمڕۆ سەرسوڕهێنەرن بۆ ئێمە و هەندێکیشیان هەڵەن، بەڵام بۆ ئەو کاتە لە پێشکەوتوترین چارەسەری پزیشکی بوون. ئیبن سینا دەرمانی نوێی بۆ چارەسەری بۆن ناخۆشی دۆزیەوە. ناویان لێ نابوو سوڵتانی پزیشکان و لە پاش مەرگیشی پزیشکانی ناوچەی ئیسلامی بە هۆی پشت بەستن بە بەرهەمەکانی ئیبن سینا توانیان پێشکەتنی بەرچاو بەدەست بێنن.



پزیشك لە کاتی چارەسەرکردنی نەخۆش.




چارەسەری فەقەراتی پشت لە کتێبی (القانون في الطب)

## فەلسەفە

ئیبن سینا زیاتر لە هەموو شتێك موشتاقی فەلسەفە بوو. لە زەمانی ئیبن سینا فەلسەفە گشتگیرتر بوو لە چاو ئێستا. ئێستا، هەر کەسێك تەنها دەتوانێ لە یەك بابەت یاخود یەك بەش لە یەك بابەت تەخەسوس وەرگرێت. لە ڕابردوودا زانایان و لێکۆڵەران بۆ دۆزینەوەی وەڵام بۆ پرسیارەکانی خۆیان، بۆ نموونە(ئایا خودا وجودی هەیە؟) ئەوا دەگەڕانەوە بۆ فەلسەفە.

فیلسوفەکانی چەرخی ناوین لە ئەوروپا هەموو کاتی خۆیان تەرەخان دەکرد بۆ پەیدا کردنی وەڵامی ئەو پرسیارانەی پەیوەست بوون بە بابەتی نامادەوە. هەروەها ڕەوشی کارکردنی ئەوان لە مەڕ فەلسەفە جیاوازتر بوو لە چاو ڕەوشی کاری ئێستا. زانایانی سەردەمی ئێمە بۆ پەیدا کردنی وڵامی پرسیارەکانیان لە گەڕاندان بۆ دۆزینەوەی زانیاری نوێ و کاملتر. زانایانی چەرخی ناوین زیاتر خۆیان دەبوێرا لە زانستی نوێ و تەنها سەرنجیان زیاتر بۆ سەر بابەتە نامادەکان بوو.

ئیبن سینا لە بەیانکردنی ئەندێشەکانی خۆی سوودی لە دوو ڕەوش وەردەگرت کە لە یونانیەکانەوە فێری ببو.( مەعلومیش نییە کە لەوانە فێربوبێت) یەکەمیان ئەوەی کە بابەتەکانی ڕێزبەندی دەکردن واتە هەر بابەتەی لەوانی تر جیادەکردەوە کە بتوانرێ بە ئاسانی موتالا بکرێن و بخرێنە ژێر لێکۆڵینەوە. دووەم بیرکردنەوەی لۆجیکانە واتە سەرنجیان دەدا بۆ هۆکاری هەر شتێك. ئیبن سینا و زۆرێك لە فیلسوفانی ئیسلامی لە وەڵامی پرسیارە فەلسەفیەکان پشتیان بە ژیریی مرۆڤ دەبەست و پێیان وابوو ژیریی باشترین شتە بۆ گەیشتن بە حەقیقەت.



دروستکردنی دەرمان



پزیشکێکی تورک لە کاتی چارەسەرکردنی نەخۆشی گوێ.

لە ڕوانەگەی هەندێك لە موسڵمانەکان بەتایبەت پیاوانی دەسەڵات، ئەقڵگەرایی مەترسی بوو بۆ سەر سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامی. بونیادی ئیسلام لەسەر وەحی وەستا بوو؛ لەم جیهانەدا هەموو شتێك بە ویستی خودا ڕوو دەدات و ژیری مرۆڤ جێی متمانە نییە. لەم سیستەمەدا هەموو شتێك پەیوەست بوو لە گەڵ یەکتری، ئەگەر یەکیان گومانی لەسەر دروستبووبا هەموو سیستەمەکە دەکەوتە ژێر گومانەوە.

پشت بەستن بە ژیریی دەبووە هۆی ئەوەی کە زۆرجار هەندێك لە یاساکان پشتگوێ بخرێن و کتێب بنوسرێت لەو بارەوە، ئیسماعیلیەکانیش مەیلیان بەلای ئەم دەستەیەوە هەبوو. ئیبن سینا و هەندێك لە فیلسوفەکانی دیکە گومانی ئەوەیان لێدەکرا کە بە نهێنی لە گەڵ شوڕشگێڕانی ئیسماعیلەیە پەیوەنیان هەبێت.

دواتر ڕوبەڕوبونەوەی گەورە لە نێوان فیلسوفەکان و زانایانی ئیسلامی ڕویدا کە بە شکستی فیلسوفەکان کۆتایی هات و ئەم شکستەش کاریگەری کردە سەر مێژووی جیهان. سەد ساڵ دواتر ئیمام غەزالی بیریاری گەورەی دونیایی ئیسلام، فیلسوف و ڕێگاکانی ئەوانی بە مەترسی ئەژمار کرد.

گەرچی غزالی خۆی فیلسوف بوو و پێی وابوو کە ژیری پێوەرێکی دروستە، بەڵام لەبەر ئەوە لە گەڵ فیلسوفان دانویان پێکەوە نەدەکولا کە پەیڕەوی کردن لە ڕێگەی فیلسوفەکان دەبووە هۆی گومڕایی خەڵکی عەوام. غەزالی پێی وابوو کە ئیمان لە ژیریی باشترە و ژیریی بە تەنهایی هاوکاری باش نییە بۆ دەرککردنی زۆرێك لە مەسائیلەکان. لەم سیستەمەدا بۆ گەیشتن بە ئیمان، باشترین ڕەوش تەجروبەی خودا ـ عیرفانە. بە بڕوای ئیمامی غەزالی ئەگەر کەسێك نەتوانێ لە ڕێگەی عیرفان(تەریقەت) خودا بناسێت، ئەوا دەبێ بێ گفتوگۆ و پرسیار کردن بۆ نزیك بوونەوە لە خودا دەبێ پەیڕەوی لە شەریعەت

و یاسای ئیسلام بکات. دوای ئەوە، هۆگری تەسەوف و عیرفان وەکو ئاگر لە خەرمانێك بەردەی ئاوا هەموو سەرزەمینی ئیسلامی گرتەوە.

هۆکاری شکستی فیلسوفەکان، هاندانی خەڵکی بێ ئاگا بوو لە فەلسفە لە دژی فیلسوفەکان و هەوڵی کەسانێك بوو لە دژیان کە فەلسەفەیان قەبوڵ نەبوو. فیلسوفەکان ڕەخنەیان لە خەڵکی عەوام دەگرت لەوەی کە خۆیان هیچ سەروەت و سامانیان نەبوو بەڵام هەڕەشەیەکی گەورە بوون بۆ دەوڵەمەندەکان و سەرمایەداراکان. بەڵام لە گەڵ ئەمانەشدا نووسین و بیرکردنەوەکانی فیلسوفەکانی ئیسلامی وەکوو ئاسارێك لە شارستانیەتی ئیسلامی لە لوتکە مایەوە. شکستی فەلسەفە لە سەرزەمینی ئیسلامی زیانێکی گەوەی دا لە دونیای ئیسلامی. لە ماوەی چوارسەد ساڵ لەسەرهەڵدانی ئیسلام، گەورەترین شارستانیەتیان هێنایە بوون کە تەنها دەکرێ شارستانیەتی چین بەرامبەرکێی بکات. ئەوانەی لە دەسەڵاتدا بوون و پێیان وابوو زانستی نوێ مەترسیە بۆیان، دژایەتییان دەکرد، ئەوانەشی بە دوای هیچ سودێکەوە نەبوون ڕویان کردە عیرفان. لەبەرئەمەشە کە لە بەرهەم و نوسینەکانی زانایانی دوای ئەم شکستە زۆر غەم و نیگەرانی دەبینرێت. بێگومان هۆکاری زۆر هەن لە ڕاوەستانی شارستانیەتی درەخشانی ئیسلامی، بەڵان گرنگترینیان شکستی فەلسفەو هێرشی مەغۆڵەکان و وێرانکاریەکانیان بوو.

## ئیبن سینا و ئەورووپا

دوو سەد ساڵ دوای ڕوبەڕوبونەوەی فیلسوفەکان و زانایانی ئیسلامی لە دونیای ئیسلامدا، لە ئەورووپاش بە هەمان شێوە ڕوبەڕوبونەوە لە نێوان کەلیسا و زانستە نوێیەکان هاتە ئاراوە.  زانایانی مسیحی و یەهودییەکان بەرهەمەکانی فەیلسوفانی یۆنانی و ئیسلامیان لە ئیسپانیا و سیسیل لە عەربیەوە تەرجەمە کردە سەر زمانی لاتینی. ئەم بەرهەمانە بەتایبەت بەرهەمەکانی ئیبن سینا گاریگەری قوڵی کردە سەر فیلسوفانی ئەورووپایی. لە سەردەمی چەرخی ناوین ئەورپا دووچاری دەمارگیریەکی توندی مەزهەبی بوو و هەربۆیەش کەلیسا دژایەتی زانستی نوێی دەکرد. لە ئەورووپای چەرخی ناوین ئامانجی فەیلەسوفەکانی ئەورووپا وەکوو سێنت تۆماس ئاکویناس و ئالبێرت ماگنویس هەماهەنگ کردنی مسیحیەت بوو لە گەڵ زانستی نوێ، و بەدیهێنانی سیستەمێك بوو کە تا سەردەمی ڕێنساس دەوامی هێنا.  ڕوبەڕوبونەوەی شوێنکەوتوانی زانست و پارێزەرانی سیستەمی کۆن بووە هۆی سەرهەڵدانی (سەردەمی ڕۆشنبیری یاخود شۆڕشی ڕوناکبیری، بگەڕێوە بۆ کتێبی سەردەمی ڕووناکبیری هەر لەم زنجیرەیەدا) و ئەم سەردەمەش ببوە هۆی سەرهەڵدانی سەردەمێك بە ناوی ڕێنسانس(نوێبوونەوەی ژیان).( هەر لەم سەردەمەدا بوو کە ڕۆژئاوا پێشی ڕۆژهەلات کەوتەوە)



تۆماس ئاکویناس

## ئیبن سینا له مێژووی جیهاندا

له سەرەتای ئەم کتێبەدا بە دوو پرسیار دەستمان پێکرد: ئیبن سینا کێ بوو؟ ٢)ئیبن سینا لە مێژووی جیهان چ ڕۆڵێکی هەبوو؟ وەڵامی پرسیاری ئەوەل ئەوەیە: ئا ــ ئیبن سینا گەورەترین هەڵکەوتوو و فیلسوف بوو، وله لوتکەی شارستانیەتی ئیسلامی بوو. بێ ــ ئیبن سینا هەوڵی ئەوەی دەدا کە ئیسلام لە گەڵ زانستی نوێ هەماهەنگ بکات. لەم زەمینەیدا دەکرێ بگوترێ ئەندێشەی هەر مرۆڤێك میراتگری ئەندێشەکانی پێش خۆیەتی و شارستانیەتە گەورەکانیش بەهەمان شێوە پێکهاتووە لە شارستانیەتی لێکجیاواز کە بە هۆی ئاڵوگۆڕی ئەندیشەو بیری مرۆڤەکانەوە هاتۆتە بوون. ئەیبن سینا دەیویست سێ شارستانیەتی گەورەی یۆنانی، ئیسلامی و مەسیحی پێکەوە گرێبدات و لەو ڕێگەیەوە بووە هۆی ئەوەی شارستانیەتی یۆنانی بە پارێزراوی مایەوە، بووە هۆی پێشکەوتنی شارستانیەتی ئیسلامی و مسیحیەتیش.

وەڵامی پرسیاری دووەم ئەوەیە کە: هەندێك کەس پێیان وایە مێژوو بریتیە لە باسکردنی جەنگەکان و هەوڵ وتەقەلای سیاسی نەتەوەکان بۆ دەسەلات، هەندێکی تر بە ڕێگاو شێوازی ژیانی خەڵکی دەخوێننەوە لە گەڵ پێشکەوتنە پیشەسازییەکان لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. ژیانی ئیبن سینا بریتی بوو لە پەرەسەندنی ئەندێشەی مرۆڤایەتی. لە هەر سەردەمێکدا ئەندێشەی مرۆڤەکان کاریگەرە و پەیوەستە بە تایبەتمەندی ژیانی مرۆڤەکانی هەمان سەردەم، بەڵام ئەندێشەو وەڵامی مرۆڤەکان لەبەرامبەر هەر پرسیارێك وەکو یەك نییە. لە هەر سەردەمێکیش لە سەردەمەکانی ژیانی مرۆڤ بە هەمان شێوە وەڵامەکانی پەیوەست بە یەك بابەتی دیاریکراو جیاوازە. هەموو مرۆڤێك کاتێك ڕووبەڕوی بابەتێك دەبێتەوە، پێش هەموو شتێك دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو و بۆ ئەو وڵامانەی کە لە ڕابردوو سەبارەت بەو بابەتە دراوە؛ دواتر بە ئەندێشەی سەردەمی خۆی وڵامی پرسیارەکە دەداتەوە. پەیڕەوی کردن لە ئیمان یان ژیریی یەکێك بوو لە پرسیارەکان کە ئیبن سینا بۆ دەستکەوتنی وەڵام پشتی بە ئەندێشەی خۆی و بیریارانی پێش خۆی دەبەست. پرسیاری ئێمەش ئەوەیە کە بۆچی دەرکی مرۆڤەکان بۆ بیرۆکە هاوشێوەکان یەکسان نییە؟